بسم الله الرحمن الرحيم

## پێناسەی خۆکوشتن

خۆکوشتن (الانتحار) لە ڕووی زمانەوانیەوە وەرگیراوە لە وشەی (نحر) واتە سەربڕین یان کوشتن. وە (انتحر) واتە خۆی کوشت یان خۆ سەربڕین، وە دەوترێت (تناحر القوم) هەرکات تا ڕادەی تیاچوون شەڕبکەن.

## خۆکوشتن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

خۆکوشتن پەنا خوا بەڵگەیە لە سەر بوونی کەم و کورتیەکی زۆر لە عەقیدەی ئەو کەسەدا، وە بەڵگەی لاوازی ئیمانە لە ناخیدا.

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بە کۆی دەنگی زانایان خۆکوشتن حەرامە، بەڵکە لە گەورەترینی تاوانە گەورەکانە خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ .. وَلا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً ﴾ النساء:٢٩

واتە: ئێوە نەفسی خۆتان مەکوژن چونکە خوای گەورە بەبەزیەە بەرامبەرتان

## سزای خۆکوژ لە ڕۆژی دوایی

زۆر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ گەورەیی تاوانی خۆکوشتن نیشان دەدات، هەروەها ئاماژە بەو هەڕەشە سەختەش دەکات کە چاوەڕوانی ئەو کەسەیە کە بەو کارە هەڵ دەستێت..

لە فەرمودەیەك دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (من تردى من جبل فقتل نفسه ، فهو في نار جهنم يتردى فيها خالداً مخلداً أبداً ، ومن تحسى سماً فقتل نفسه فسمه في يده يتحساه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبدا، ومن قتل نفسه بحديدة فحديدته في يده يجأ بها في بطنه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً ) رواه البخاري

واتە ئەوەی خۆی فڕێ بداتە خوارەوە لە چیایەك و خۆی بکوژێت ئەوا لە ئاگری دۆزەخ دا هەتاهەتایی خۆی فڕێ دەداتە خوارەوە، وە ئەوەی ژەهر بخواتەوە و خۆی بکوژێت ئەوا ژەهرەکەی بەدەستەوە دەبێت لە ئاگری دۆزەخ دا تا هەتاهەتایی دەیخواتەوە، ...)

ئەم فەرمودەیە دەری دەخات کە ئەو کەسەی بە ئەنقەست خۆی دەکوژێت بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە ..وە مانەوەی لە ئاگری دۆزەخدا بە هەمیشەیی بۆ ئەوە دەگەڕێنرێتەوە کە مردنی بۆ خۆی بە حەڵاڵ زانیوە بەوەی خۆی بکوژێت.. وە هەرکەسیش یەکێك لە تاوانە



گەورەكان (الكبائر) بۆ خۆی حەلاڵ بكات لای ئەهلی سوننە و جەماعە بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەبێت بەو هۆیەوە شتێكی حەلاڵ كردووە كە خوای گەورە حەرامی كردووە.

## ئەركی دەوڵەت بەرامبەر بە هاولاٚتیان

دەوڵەت بەرپرسیاریەتی گەورەی لە ئەستۆیە سەبارەت بە هاولاٚتیان بە دابین كردنی ژیانێكی بە كەرامەت بۆیان، وە دوریان خاتەوە لە دەست پان كردنەوە و پاڕانەوە و گرتنە بەری هۆكاری نابەجێ لە پێناو پەیدا كردنی پێداویستیەكانیان بەوەی كاریان بۆ دابین بكات و بە هانای ئەوانەوە بچێت كە دەست كورت و هەژارن وە پاڵپشتی پێداویستییە بنچینەییەكان بكات لە خۆراك و جل و بەرگ و ئامرازەكانی خوێندن و تەندروستی...هتد ،تا بەهۆیەوە هۆكاری ئەوە نەیەتە ئاراوە كەسێك بیر لەوە بكاتەوە خۆی لە ناو بەرێت، بەلاٚم ئایا دەستەلاٚتداران لە ئێستادا تا چ ڕادەیەك بەم ئەركە هەستاون؟! یان بەراشكاوی بپرسین ئایا دەستەلاٚتدارن خۆیان نەبونەتە هۆكار و زەمینە خۆشكەر بۆ ئەوەی خەڵك بیر لە هۆكارەكانی خۆتیابردن بكاتەوەو بەهۆی ئەو هەموو نا عەدالەتیی و دروستكردنی چینایەتییەی لە كۆمەڵگاكاندا خوڵقاندویانە ؟!

## دیاردەی خۆكوشتن لە كوردستان

هەرچەندە ئامارێكی دروست لەبەردەستدا نییە سەبارەت بەرێژەی خۆكوشتن لە كوردستان، كە لە ڕاستیدا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ بەكەم نرخاندنی تاكی مرۆڤی كورد لە لایەن دەسەلاٚتدارە عەلمانیەكانی كوردەوە، بەلاٚم بە موتابەعەكردنی ژیانی رۆژانە و هەواڵە پەرش و بلاٚوەكان دەری دەخەن كە رێژەكە زۆر مەترسیدارەو بەردەوامیش لەبرەودایە وەك لەزۆرێك لەدەزگاكانی راگەیاندنەوە دەبینین و دەبیستین ، بە تایبەت لە سایەی دەسەلاٚتی عەلمانیەتی كورد بە ڕادەیەك ئەو دیاردەیە زیادیكردووە كە هەرگیز لە سەردەمی دەسەلاٚتە یەك لە دوای یەكەكاندا بەو ئەندازەیە نەبووە.

بە وردبوونەوەیەك لەو لێكۆڵینەوانەی كە زانایان و لێكۆڵەرەوان ئاماژە بە هۆكارەكانی ئەم دیاردەیە دەكەن دەتوانین هۆكارەكانی لە كوردستانیش لە ڕوانگەی هەمان ئەو هۆكارانەوە بگەڕێنینەوە بۆ ئەمانەی خوارەوە:

- لاواز بوونی بیروباوەڕی ئیسلامی و دوركەوتنەوە لە ڕەوشت و بەها ئیسلامیەكان كە لە قورئان

و سوننەتدا ئاماژەیان پێکراوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك:

١. خەڵکی ڕوویان کردۆتە دونیاو قیامەتیان بیرچۆتەوە و هەمیشە وێڵن بە شوێن تێرکردنی ئارەزووەکانیان.

٢. عەلمانیەتی کوردی توانیویەتی هەر جارەی بە دروشمێکی بریقەدار ئەو خەڵکە چەواشە بکات و وایان تێ بگەیەنێت کە ئیسلام سەرچاوەی هەموو کێشەکانیانە و بەدیلیش عەلمانیەت و بەرکەنارکردنی ئیسلامە، جا دەسەڵاتداری عەلمانیەتی کوردی ئەوەی بە ڕاگەیاندن و ئەدەبیاتی چەواشە بۆی چوبێتە سەر ئەوا کردوویەتی ئەوەشی کە بۆی نەکرابێت بە هەڕەشەو گرتن و تۆقاندنی ئەو خەڵکە کردوویەتی .

٣. هۆکارێکی تر مەلای سەر بەدەسەڵاتدارەکان و ئەو لایەنانەیە کە ئەوەندە خۆیان لە عەلمانیەت نزیك خستۆتەوە و پشتیوانیان لێ دەکەن ئیسلامێکیان هێناوەتە ئاراوە لە عەلمانیەت و مەنهەجی ئەوانەوە زیاتر نزیکە تا ئەوەی لە ئیسلامەوە نزیك بێت، بێگومان ئیسلامێکیش دوور لە سەرچاوەی خۆیەوە کە قورئان و سوننەتە نەك هەر کاریگەری باشی نابێت بەڵکو زیانی زۆر زۆرە و لەوەش زیاتر هێندەی ئەم خەڵکی چەواشە دەکات و لە بنچینەی ئیسلام دوری دەخاتەوە کابرای عەلمانی ئەوەندەی پێ ناکرێت.

ئالێرەوە تاکی کوردی لە گێژاودا دەژی و لە ئیسلام دورکەوتەوە یان دورخرایەوە و بەدیلەکەشی لە ئەزمونی دوای ڕاپەڕین بە دیارکەوت کە نەك چارەیان پێ نییە و پێشیان نابێت بەڵکو هەرخۆیان سەرچاوەی زۆربەی هەرزۆری کێشەکانی ئەو خەڵکەن.

- تاکی کورد هەست بە نامۆیی دەکات، دەسەڵات بە خاوەنی کێشەکانی خۆی نازانێت و خۆشی چارەسەری پێ نییە بۆ کێشەکانی، هەر بۆیە پەنا دەباتە بەر ئارەق و تلیاك و مادە هۆشبەرەکان، ئەمەش چارەی کێشەکەی ناکات ئەگەر قوڵتری نەکردبێتەوە، بە تایبەت لە گەڵ ئەو حاڵەتی هەژاری و بێکاریەی کە یەخەی خەڵکی گرتۆتەوە و هەزاران هەزاری ناچار کرد ڕێگەی هەندەران بگرنە بەر و وڵات بە جێ بهێڵن، وە زۆرێکیش ئەمەی بۆ نەدەلوا (هەرچەندە ئەوانەی کە چوشن بۆ هەندەران ئەگەر کارێکیان دەست کەوتبێت و مافی پەنا هەندەییشیان وەرگرتبێت ئەوا کێشە

دەرونیەکانیان دور لە ئیسلام بە بێ چارەسەر ماوەتەوە وەك ئەو خەڵکە بێ بڕوایەی کە لەو وڵاتانە هەن و لە هیچیان کەم نیە و ئەوسا پەناش دەبەنە بەر دیاردەی خۆکوشتن).. ئالێرەوە خۆ لەناوبردنی لەلا ئاسان دەبێت و هەست دەکات هەموو دەرویەکی لێداخراوە، و لەم دونیایە جێگەی نابێتەوە وە واهەست دەکات کەسێکی قێزەونە لە دیدی ئەو کۆمەڵگەیەدا، ئەمیش بیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە کە چارەسەری خۆی تیا دەبینێتەوە.

• دیاردەی بێکاری و هەژاری هەروەك ئاماژەمان پێکرد هۆکارێکی گرنگی کێشەکەیە.. ئاشکرایە کە لە دوای ڕاپەڕینەوە تەنها بوارێك هەبوبێت لە بەردەم ئەو خەڵکە چەك هەڵگرتن بووە بۆ هەردوو حیزبی دەسەڵاتداری یەکێتی و پارتی، وە ئەو خەڵکەش کە ئامادە نەبووە ویژدانی خۆی بفرۆشێت بەو دوو لایەنە ئەوا زۆرکات بێکار بووە ئەگەر لەوەش زیاتر دژایەتی نەکرابێت و دوچاری ڕاوەدونان نەبوبێتەوە لەلایەن ئەو دوو حیزبەوە، وە ئەو خەڵکەش کە بۆ مەسەلەی مادده چۆتە ناو ئەو دوو حیزبەوە بێگومان ڕۆژانە ویژدانی ئازاری دەدات بەوەی زۆر شتی نالەبارو نەشیاو دەبینێت بەرپرس و کادێرو ئەندامی ئەو دوو حیزبە ئەنجامی دەدەن و ئەمیش بەو مەبەستە نانی نەبڕن پێ دەنێت بەویژدانی خۆیدا و خۆی بێ دەنگ دەکات.. بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ناخی زیاتر ئازاری دەدات و چارەسەریشی پێ نیە.. ئالێرەوە پاڵنەرێکی تر زیاد دەبێت و بۆی دەردەکەوێت کە هیچ شتێك نیە شایستەی ئەوەبێت بۆی بژی.. تەنانەت ئەو کوردایەتیەی کە ساڵەهای ساڵ بوو خەڵکی پێ چەواشە دەکرا هەمووی درۆو دەلەسە بوو.. وە هەمووی بۆ بەرژەوەندی گیرفانی دەسەڵاتداران و زورناژەنەکانی شوێنیان بوو.

• باری کۆمەڵایەتی و نادیاری چارەنوس و دەستکورتی و درەنگ ژن هێنان و شووکردن و مەترسی گوزەران هەموو ئەمانەش فشارێکی دەرونی زۆر زۆری خستۆتە سەر گەنجی کورد بە تایبەت لە تەمەنی بیستەکان وە زۆر جار وادەبێت ئەو لاوە بەرگەی ئەو بارە دەرونیە سەختەی خۆی ناگرێت و ئاسۆی ڕوون نابینێتەوە و بیر لە خۆڕزگارکردن دەکاتەوە لەو واقیعە بەوەی خۆی لەناو ببات.

• ساڵەهای ساڵە عەلمانیەتی کوردی مێشکی ئەو خەڵکەی بردووە بە باسی ئازادی و دیموکراسی و مافی ڕادەربڕین، بەڵام هەمووش دەبینین ئەو دروشمانە هەمووی چەواشە کردن بوون و بەڵکو خەڵك بۆ خۆپیشاندانی ئاشتیانەش کە داوای سادەترین مافی خۆی دەکات لە دابین کردنی ئاوو کارەبا ئەوەتا بە فیشەك وەڵام دەدرێتەوە ڕاپێچی زیندان دەکرێت! ئالێرەوە ئاوڕ لەتەمەنی خۆی دەداتەوە کە

ساڵەهای ساڵە هەرچی هەوڵێكی دا بە فیڕۆ چوو وە ساڵەهای ساڵە بە دروشمی درۆ چەواشەیان كردووە (وە دوور نیە خۆشی بە نیەتی باش ڕەواجی بەو دروشمانە دابێت كەوا تازە چەواشەییەكەی بۆدەركەوتووە)، ئالێرەوە هۆكاری تر زیاد دەبێت لە دڵ و دەرونی تاكی كوردا كە هیچ پیرۆزیەك نەماوە بیبەستێتەوە بەم ژیانەوە، وە تەنانەت ئەو كەسەش لە هاوشێوەی جەلال و مەسعود و دەسەڵاتدارانی ئەو دوو حیزبە كە ئەم كردبوونیە پێشەنگی خۆی ئەوا بینرا كە گەیشتنە سەر كورسی دەسەڵات ئەمانیش بوونە چەندین سەددامی تر..جا ئەگەر جاران لە دژی سەدامێك ئەو هەموو قوربانیەی دابێت ئایا تۆ بڵێیت چەندی تری دەوێت بۆ لە ناوبردنی ئەم هەموو سەدامەی تر كە لەبەرگی كوردیدا خوێنی ئەو خەڵكە دەمژن .

- سزادانی تاكی كورد لە لایەن ئەو دوو حیزبەوە بە هۆكارو بە بێ هۆكار، لە بەرامبەریشدا بەرپرسان و دەسەڵاتدارانی هەردوولایان دورن لە هەموو جۆرە لێ پرسینەوەیەك و بەردەوام لێرەو لەوێ دەست درێژی دەكەنە سەر ئەم و ئەو بەشێوەیەك دوو چین دروست بووە، چینی دەسەڵاتدار كە هەموو ئازادیەكی پێدراوە ، چینی دووەم كە زۆرینەیە و مافی خۆپیشاندان و نارەزایشیان لێ زەوت كراوە و بەڵكو بە دەستی تێكدەرو ئاژاوەگێڕو ناحەز لەقەڵەم دەدرێت.

كاتێك تاكی كورد ئەو كەلێنە گەورە دەبینێت لە نێوان خواست و حەزەكانی وە ئەوەی كە لەواقیعدا هەیەتی لە بەرامبەریشدا كادێرو بەرپرسانی ئەو دوو حیزبە دەبینێت لە دوای ڕاپەڕینەوە زەروو ئاسا هەموو سەرروەت و سامانی ئەو كوردستانەیان بۆ خۆیان قۆرخ كردووە بە ئەندازەیەك كە نەك هەر بەرپرسان بەڵكو خزمی دوریشیان دەوڵەمەند بوون، ئالەو واقیعەدا كەسێك كە سەرنجی توانای خۆی دەدات و لە گەڵ ئاستی حەزو ئارەزووەكانیدا بەراوردی دەكات و لەولاشەوە دەبینێت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەكنەلۆجیا لە بەرەو پێش چوندایەو ئەمیش لێ ی بێ بەشە ئەمە دوچاری نامۆیی و دڵەڕاوكێی دەكات و بۆی دەبێتە هۆكارێك بۆ توش بوون بە دڵ توندی (كآبة).

## شێواندنی ڕاستیەكان

ڕاگەیاندنی كافرو مورتەدان تا ڕادەیەكی زۆر توانیویانە چالاكی ئیستشهادی موجاهیدان لە خەڵكی بشێوێنن و بە چالاكی خۆكوژی لە قەڵەم بدەن، ئاشكرایە پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرمودەی خۆیدا ئاماژە بەوە دەكات كە بەر لە هاتنی ڕۆژی دوایی وادەبێت شتەكان بە غەیری خۆی ناودەنرێن.

ئەم چالاكیە شەهادەتخوازیانە( ئیستیشهادی) نەك ناچێتە ژێر پێناسەی ئەو خۆ كوشتنەی كە لە




سەرەتادا ئاماژەمان پێکرد، بەڵکو ئەو کارە لە لایەن زانایانی بڕواپێکراوی ئیسلامەوە لە کۆن و نوێ زۆر ستایش کراوە وە نیشانەی بەهێزی ئیمانی خاوەنەکەشیەتی کە تا ئەو ڕادەیە ئامادەیە قوربانی بە خۆی بدات لە پێناو گێرانەوەی عیزەت‌و کیان بۆ دینەکەی.

ئەوەیشی کە زیاتر بۆتە هۆی سەرگرتنی ئەم تەڵەکەبازیە ئەوەیە کە لەهەردوو حاڵەت دا ئەو مرۆڤە بە ویستی خۆی بەرەو مەرگ دەچێت، بەڵام ئەم پێوانەیە ڕاست نیە، بۆ نموونە گەر کابرایەکی ڕێگر و دز هەستا بە کوشتنی یەکێك بە کلاشینکۆف بە مەبەستی بردنی ماڵەکەی ئایا وەك ئەو سەربازە وایە کە بە هەمان چەکی کلاشینکۆف لە گۆڕەپانی جەنگ دا بەرگری لە وڵاتەکەی دەکات و دوژمنێك دەکوژێت؟ خۆ لە هەردووباردا کردارەکە بریتیە لە کوشتنی یەکێك بە چەك، جا مەرج نیە لێك چوونی هۆی شتەکە ببێتە ئەوەی کە حوکمیان وەك یەك بێت، بەڵکو دەبێت سەیری ئەنجامەکەی بکرێت.

پاشان دەڵێین هەرکەس فلیمی ئەو برایانە ببینێت کە بەر لە ئەنجامدانی ئەو چالاکیە تۆماری دەکەن بە ئاشکرا ئەوە دەبینێت کە ئەوانە کە سانێك نین لە ژیان بێزاربووبن و نەخۆشی دەروونیان هەبێت و یان لە نەبوونیدا ئەوە بکەن، بەڵکو لە ساتە وەختی هەنگاو نان بۆ ئەو ئامانجە لەو پەڕی خۆشحاڵیدان و دەمیان بە پێکەنینە، وە هەرگیز ناچێت بە عەقڵی هیچ کەسێکدا یەکێك تەنها لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا ڕێگەی سەختی جیهادی هەڵبژاردبێت و پشتی لە دونیا هەڵکردبێت لە پێناو بە دەست هێنانی دواڕۆژ و بچێت بۆ ئەو چالاکیە ئیستشهادیە ئینجا ئەمە پێی بوترێ خۆکوشتن..

## دەرئەنجام

ئەو کەسەی کە دوور لە سەرچاوەی ئیسلام مەسەلەکان هەڵبسەنگێنێت بێگومان ڕووبەڕووی حەقیقەتێکی تاڵ دەبێتەوە پێ ی هەرس ناکرێت، ئەویش ئەوەیە چۆن هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار کە گوایە کوردن بە شێوەیەك ڕەفتارو مامەڵە دەکەن لە گەڵ ئەو میللەتە کە ئەو هەموو قوربانیەی داوە و ئێستا ئەمان بەو ڕادەیە بێ وەفان بەرامبەری ، بەڵکو زوڵم زۆری ئەمان بەکەمتر نابینێت لە زوڵم و زۆری حیزبی بەعس.

لەو لاشەوە ئەو خەڵکە وا ترسێنراوە گوایە هەر هەڵوێستێك وەربگرێت ئەوا زیان بە ڕەوشی




کوردستان دەگەیەنێت وە دەسەڵاتدارانیش ئەو مەسەلەیان کردۆتە کوتەکێك و دەیدەن بەسەری هەر کەسێکدا کە بیەوێت لەو قاڵبە مل کەچ و زەلیلیە دەربچێت.

لەسەرەنجام دا ئەو خەڵکە کێشەکەی قوڵ دەبێتەوە و مێشکی ماندو دەبێت و لە کەمترین بوارێکدا مەبەستێتی ئەوەی لە ناخیدا قەتیسماوە دەری بڕێت بەڵام هەرووەك لە خۆپیشاندانەکاندا بینیمان عەلمانیەتی کوردی ئەوەشیان بەو خەڵکە ڕەوا نەبینی.

وە ئەو خەڵکەش کە ساڵانێکە بونەتە پشتیوانی شۆڕشی چەواشەی عەلمانیەت وا ئەمڕۆ بەری ئەو دڕکە دەدورنەوە کە ساڵانێك بە خوێنی خۆیان ئاویان دەدا..بۆیە هەست دەکەن دونیایەکەیان لە دەست داوە.. بەڵکو لەبەر بێ باوەڕی و نەبوونی تێگەیشتنێکی ڕاست خەریکە واژیانیش لە دەست بدەن و ڕوو بکەنە خۆکوشتن.

## سەرچاوەکان :


- الانتحار اسبابه ودوافعه – منتديات شبكة صامطة الثقافية
- الانتحار دوافعه وعلاجه –إبراهيم بن ناصر الحمود
- الــموت اختيــارا– د. فخري الدباغ–دار الطليعة – بيروت




